پرۆدیسیۆسی سیۆس، فەیلەسووفێکی دیکەی سەر بە فێرگەی سەفسەتەیە، لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا ژیاوە. ماوەیەک کاری دیبلۆماسی پێ دراوە. باوەڕی بە بوونی سروشت هەبووە و هەموو شتێکی سوودبەخشی بە خواوەند داناوە. (وەرگێڕ)

64 – لە ئەفسانەی یۆنانییدا مستیلەکەی گیگس و کڵاوەکەی هادیس باس کراون. هەرکەسێک ئەم مستیلەیەی لە پەنجە کردبێت، یان کڵاوەکەی لەسەر کردبێت، نەبینراوەو توانیویەتی هەموو شتێک بکات. (وەرگێڕ)

65 – ئەم ڕووداوە هۆمیرۆس لە (ئۆدیسا)دا باسی کردووە، بە داستانی ئەلکینۆس ناسراوە. ئەفلاتوون لەم چیرۆکەوە دەیەوێت باسی خەڵات و سزادانی خواکان پاش مردن بکات. ئەم بیروباوەڕە لە ئایینی سامییەکاندا بووە بە یەکێک لە بنەڕەتەکانی بڕوا. (وەرگێڕ)

66 – ئەردیۆس فەرمانڕەوایەکی زۆرداری یۆنانی بووە. باوک و براکەی خۆی بۆ دەسەڵات کوشتووە. (وەرگێڕ)

67 – تامیرس لە ئەفسانەی یۆنانییدا شاعیر و گۆرانیبێژێکی دەنگخۆش بووە. لەو باوەڕەدا بووە لە گۆرانیگوتندا دەتوانێت لە میسۆسەکان بەرێتەوە. لەبەرئەمە میسۆسەکان دەنگیان لێ سەند و چاویشیان کوێر کرد. (وەرگێڕ)

68 – ئاجاکسی کوڕی تیلامۆن قارەمانێکی ئەفسانەی یۆنانییە. کاتێک ئەخیلس کوژرا، ویستی چەکەکەی بۆ خۆی بەرێت، بەڵام بەپێچەوانەی حەز و ئارەزووی ئەوەوە، چەکەکە بە خەڵات بە ئۆدیسا درا. دوای ئەمە ئاجاکس شێت دەبێت و خۆی دەکوژێت. (وەرگێڕ)

69 – ئەتەلەنتا لە ئەفسانەی یۆنانییدا خاتوو ڕاوکەرە. بڕیاری داوە هاوسەری ئەو پیاوە بکات، کە دەتوانێت لە پێشبڕکێی ڕاکردندا لێی بباتەوە. ئەوەی نەتوانێت دەیکوژێت. (وەرگێڕ)

70 – ئێپیۆس کوڕی پانۆپیۆس لە ئۆدیسەی هۆمیرۆسدا باس کراوە. گوایە ئەو یارمەتی ئەسینای داوە ئەسپەکەی ترۆجان لە تەختە و دار دروست بکەن. (وەرگێڕ)

71 – تێرستیس یەکێکە لەو سەربازانەی لە ئیلیادی هۆمیرۆسدا ڕەخنە لە ئاگامەمنون دەگرێت. (وەرگێڕ)



